# ئیسلامی؛
# بە شێوازێکی ئەمریکیانە !

شیخ: صلاح بن عبد الفتاح الخالدی
و: ئوسامە عبد الله



"ئیسلامییەکان"، ئەو ناوەی وەسفی خەڵکانێکی پێ دەکرێ کە بانگەواز بۆ ئیسلام دەکەن وبە ئیسلامەوە دەجووڵێنەوە، بۆیە وەسفێکی بانگخوازی وبزاوتییە وستایشێکی هەڵگرانییەتی، ئەوانەی کە خەمی ئیسلام وموسوڵمانانیان لە خۆ گرتووە، بەڵام "ئەمریکای تێکدەر" حەز دەکا دەست لە هەموو شتێ وەردا وسەر لە هەموو کونێك بنێتەوە، دەستی بۆ هەر شتێکیش بەرێ حەتمەن ئەبێ تێکیدا وهەر شتێ بە پێوە بێ ئەبێ وێرانیکا، چ لە فیکر بێ چ لە ڕۆشنبیری وزانست وزانیاری ومەعریفەت بێ، چ لە سیاسەت وئابووری وکار وئیدارە بێ، یا لە بەهاو ڕەفتار وڕەوشتدا بێت ؛

ئەمریکا ئیسلامێکی ئەمریکییانەی دەوێ بە پێی "پێوەر وبەها" ئەمریکییە تێکدەرەکان دیزاین کرابێ، خەڵکانێکی "ئیسلامی" دەوێ بانگەشە بۆ ئیسلامێکی ئەمریکایی بکەن وبە پێی ئەو ئیسلامەوە بجووڵێنەوە ولە نێو خەڵکیدا بڵاوکەنەوە، هەر ئەبێ ئەو ئیسلامییانەش بە پێی شێواز وستایلی ئەمریکییەوە "بەرهەم بێنرێن"، ئەو شێوازەی مرۆڤ تێیدا تەنها "کاڵایەکە" کە لە کارگەی ئەمریکادا بەرهەم دەهێنرێت.

ساڵێك لەمەوبەر ڕێکخراوێکی ئیسلامی لە ئەمریکا بە ناوی "موسوڵمانانی ئازاد لە دژی تیرۆر دا" دامەزرا، ئەندامەکانی کۆمەڵە "ئیسلامییەکن لەسەر شێوەڕێی ئەمریکایی"، ئەم ڕێکخراوە ئیسلامییە لە ئەمریکای ئازاد دا چاڵاکەو ولە ناوەوە ودەرەوەی ئەمریکا خەریکی بانگەوازە، تا ئێستاش ئەمریکا سێزدە لقی بۆ کردۆتەوە، بەم زوانەش لقێکی لە میسرِدا بۆ دەکاتەوە ولە داهاتووی نزیکدا لە تەواوی جیهاندا بڵاو دەبێتەوەو، ئەمریکا لە هەموو شتێکدا کۆمەکی دەکا ؛

**ئەم ڕێکخراوە ئیسلامییە "ڕووی ئەمریکای ئیسلامییە" لە دەرەوەو، هەر کۆنگرەیەکی نێودەوڵەتی هەبێ ئەندامانی نوێنەرایەتی ئەمریکا دەکەن. ئەم هەفتەیە کۆنگرەیەکی جیهانی لە ئیسپانیا لە باسی بانگەشەکردن بۆ ئاشتی وڕوو بەڕوو بوونەوەی تیرۆردا بەسترا، لەو کۆنگرەیەدا شاندێکی ئەم ڕێکخراوە ئیسلامییە بەشداربوو وئەندامانی شاندەکە لە کۆنگرەکەدا بە ناوی ئیسلامی ئەمریکاییەوە قسەیان دەکرد ! سەرۆکی ئەم ڕێکخراوە پارێزەر (کەمال نەعواش)ی بە ڕەچەڵەك فەلەستینییە ولە ئەمریکا پێگەیشتووەو، بە پێی دیزاینە ئەمریکییەکانەوە بەرهەم هاتووەو، بە شێوەڕێی ئەمریکا پرۆگرام کراوە، کەمال نەعواش بانگەشە بۆ ئیسلامی تێگەیشتووی ئاشتیخواز دەکات، ئەو ئیسلامەی بڕوانامە وشایەتی ئەمریکایی بە دەست دێنێ !**

**قەدەری خوا بەشێکم لە وتەکانی "نەعواش" لە چاوپێکەتنێکی ڕادیۆییدا بیست، خەریك بوو موژدەی فیکر وبیرو ڕاکانی ڕێکخراوە ئیسلامییەکەی بە خەڵك دەدا، ئیتر لە قسەکانیدا وتی: (ئامانجی ڕێکخراوە ئیسلامییەکەی بەرگری کردن لە ئیسلام وموسوڵمانانە لە بەرامبەر توندڕەو ودەمارگیر وتیرۆریستەکان، لە ساڵی ١٩٧٩وە بیری تیرۆر خەریکە پەخش دەبێتەوەو؛ دەنگی بەرز بۆتە دەنگی تیرۆریزم، کەچی موسوڵمانە لێبوردەکان بێ دەنگن وتەعەدایان لێ دەکرێ ! ئێمە بانگخواز وئیمامی عەرەبمان لە ئەمریکادا ناوێ، چون خەڵکانێکی تیرۆریستن ولە سەدەی حەوتەمی زاینیدا ژیان دەکەنو، بە کەڵکی ئێمە نایەن، ئێمە دەمانەوێ موسوڵمانە هاوچەرخەکان ئیمامماں بن، کە نەوەی نوێی موسوڵمانانی ئەمریکان !).**

**هەروەها دەڵێ: (ئێمە ئیسلامێکمان دەوێ کاری بە سیاسەتەوە نەبێت، دین ودەوڵەت لێك جیاکاتەوەو، یەکسانی تەواو لە هەموو شتێکدا لە نێوان پیاو وئافرەتدا فەراهەمکا) !!**

**موسوڵمانان ..**

**ئاگاداربن وچاوتان بکەنەوە وحەزەر کەن وجێگیر بنو، بە ڕووی ئیسلامییە ئەمریکییە تازەکانەوە بوەستنەوە !!**